# ناوی نامە : أيها الولد

## نوسـەر : العلامة الإمام حجة الإسلام
## أبو حامد الغزالي (رضي الله عنه)

## وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد



بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

## هۆكاری نوسینی ئەم نامەیە :

**الحمد لله رب العالمين ، و العاقبة للمتقين ، و الصـــلاة و الســـلام على نبيه محمد و آله أجمعين.**

**بزانە کە یەکێک لە خوێندکارە پێشـــکەوتووەکان ، لەخزمەت شـــێخ ئیمام زین الدین حوجەتی ئیســـلام ئەبی حامید محمد کوڕی محمدی غەزالی ڕەحمەتی خودای لێ بێت بوو ، ســـەرقاڵبوو بە فێربوون و خوێندنی زانســـت ، هەتا زۆرێک لە وردەکاری زانســـتەکانی کۆکردەوە ، فەزیڵەتەکانی نەفســـی تەواو کرد ، پاشـــان ڕۆژێکیان بیری لە حاڵی خۆی دەکردەوە ، پاشـــان هاتە یادی و گوتی : من چەندەها جۆر لە زانستم خوێندووە ، تەمەنی گەنجیم سەرف کردووە لە فێربوونی زانست و کۆکردنەوەی ، ئێستاش پێویستە بزانم کام لەو زانستانە سبەی سودی بۆم دەبێت و لە ئاخیرەتدا خەمخۆرم دەبێت ؟ کامەشـــیان بێ ســـودە هەتا وازی لێ بهێنم ؟**

**پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عِلْمٍ لا يَنْفَعُ)[1] واتا : خودایە پەنات پێ دەگرم لە زانستێک کە سوودی نەبێت.**

**بۆیە ئەم بیرکردنەوەیە لای ئەو خوێندکارە بەردەوام بوو هەتا نامەیەکی بۆ حەزرەتی شێخ حجة الاسلام محمدی غەزالی ڕەحمەتی خودای لێ بێت نوسی و فتوای لێ وەرگرت ، پرسیاری هەندێک مەسئەلەی لێ کرد ، داوای ئامۆژگاری و دووعای خێری لێ کرد .**

**فەرمووی : هەرچەندە نوسینەکانی شێخ وەک ئیحیا[2] و بەرهەمەکانی تر وەڵامی مەسئەلەکانمی تێدایە ، بەڵام مەبەستم لەوەیە کە شێخ پێویستیەکانم لە**

---

[1] صحيح مسلم - ٢٧٢٢
[2] إحياء علوم الدين

**چەند پارچە کاغەزێکدا بۆ بنوسێت کە هەموو ژیانم لەگەڵم بێت و کاری پێ بکەم لە ماوەی تەمەنم دا ، إن شاء الله تعالى**

**شێخیش لە وەڵامدا ئەم نامەیەی بۆ نوسی کە ناسراوە بە نامەی (أيها الولد – ڕۆڵەکەم) :**

## بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

**بزانە ئەی ڕۆڵە خۆشەویست و نازدارەکەم خودای گەورە درێژە بە مانەوەت بدا لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ، بتخاتە سەر ڕێگای خۆشەویستانی ، کە پەیامەکانی ئامۆژگاری دەنوسرێتەوە لە خاوەن پەیامەوە علیه الصلاة و السلام ، ئەگەر پەیامی ئامۆژگاریەکانی ئەوت پێ گەیشتووە چ پێویستیت بە ئامۆژگاری منە ؟ ئەگەریش پێت نەگەیشتووە ئەوا پێم بڵێ : چیت دەست کەوتووە لەماوەی ئەم ساڵانەی پێشوو ؟!!**

**هەندێک لەوانەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئامۆژگاری ئومەتەکەی پێ کردووە فەرموویەتی ( نیشانەی پشت تێکردنی[3] خودا لە بەندەکەی سەرقاڵبوونی بەندەکەیەتی بەو شتانەی حەقیان بە ئەوەوە نیە ، ئەگەر مرۆڤێکیش ساتێک لە تەمەنی بڕوات کە بۆ ئەوە تەرخانی نەکردبێت کە لەبەری خەلق کراوە ، ئەوا دەبێ ئاە و حەسرەت درێژە بکێشیت بەسەریدا ، ئەوەشی تەمەنی چل ساڵانی تێپەڕاند و چاکەکەی بەسەر خراپەکەی زاڵ نەبوو ئەوا با خۆی ئامادە بکات بۆ ئاگر)[4]**

**ئەم ئامۆژگاریەش کافیە بۆ زانیاران.**

---

[3] ئەم دەستەواژەیە مەجازیە و مەبەست لێی بێبەشبوونە لە ڕەحمی خودا

[4] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (چاکێتی موسوڵمانێتی مرۆڤ لەوەدایە واز لەو شتانە بهێنێت کە پەیوەندی بەوەوە نیە ) صحيح ابن حبان - ٢٢٩

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**ئامۆژگاری ئاسانە ، کێشەکە قبوڵکردنیەتی ، چونکە تامی ئامۆژگاریەکە لای شوێنکەوتوانی حەز و ئارەزوو تاڵە ، کە ڕێگە پێنەدراوەکان لە دڵیاندا خۆشەویستە ، بەتایبەتیش ئەو کەسانەی سەرقاڵن بە داواکردنی زانست و پاککردنەوە و ڕووناککردنەوەی دەروونی خۆیان و حەزەکانی دونیا ، پێی وادەبێت کە تەنها زانست بەسە بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت ، بەوەش پێویست بە کارکردن ناکات ، ئەمەش باوەڕی فەیلەسوفەکانە .**

**سبحان الله العظیم !! ئەوەندە نازانێت کە کاتێک ئەم زانستەی دەست کەوتووە ئەگەر کاری پێ نەکات ئەوا دەبێت بە بەڵگە بەسەریەوە ، وەک پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی : (أشدُّ النَّاسِ عذابًا یومَ القیامةِ عالِمٌ لم ینفعهُ اللَّهُ سبحانه بعلمِهِ) [٥] واتا سەختترین سزای خەڵک لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر زانایەک دەسەپێندرێت کە خودای گەورە سودی پێنەگەیاندبێت بەو زانستەی دەستی کەوتووە .**

**باسکراوە : حەزرەتی شێخ جونەیدی بەغدادی (قدس الله روحه) لە خەودا بینرا دوای مردنی ، پێی وترا : هەواڵ چیە ئەی ئەبو قاسم ؟ فەرمووی : دەستەواژەکان شڕ بوون و هێماکان لەناوچوون و ئەوەی سودی پێگەیاندم تەنها ئەو نوێژانە بوو کە دەمانکرد لە تاریکی شەودا .**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**لەکارەکاندا بێ کار مەبە و لە ئەحواڵەکاندا بەتاڵ مەبە ، دڵنیابە کە زانست بەتەنها سودت پێناگەیەنێت .**

**بۆنمونە : ئەگەر پیاوێک لە دەشت بێت دە شمشێری هندی و چەکی تری پێ بێت ، پیاوەکەش چاونەترس بێت و پیاوی جەنگ بێت ، شێرێکی گەورەی**

---

[٥] شعب الإیمان للبیهقي - ١٧٧٨

**ســـــامناکـی لـێ پـەیدا ببێت ، گـومانت چیە ؟ ئایا چـەکـەکـان بەڵاکـەی لـەســـەر لادەبەن ئەگەر نەزانێت بەکاریان بهێنێت یان بیانوەشێنێت ؟!**

**زانراویشـــە کـە بەڵاکـە لانادات مـەگـەر بـە جوڵە یان لێدان نەبێت ، بەم شـێوەیەش ئەگەر پیاوێک سـەد هەزار مەسـەلەی زانسـتی بخوێنێت و فێری ببێت ، و کاری پێ نەکات ، ئەوا سودی پێناگەیەنێت ئەگەر کاری پێ نەکات.**

**هەروەها نمونەی : ئەگەر کە سێک تای هەبێت و نەخۆ شـی زەردوویی هەبێت ئەوە چارە سـەرەکـەی بە بەکارهێنانی ( سـکنجبین و کـشـکـاب)[6]دەبێت ، چاک نابێتەوە و شیفای بۆ نایەت هەتا بەکاریان نەهێنێت .**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**گەر ســـەد ســـاڵ زانســـت بخوێنیت ، هەزار کتێب کۆبکەیتەوە ، ئامادەنیت بۆ ڕەحمەتی خودا ئەگەر کاری پێ نەکەیت وەک خودای گەورە دەفەرموێت ( وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنسَـــانِ إِلَّا مَـا سَـــعَى )[7]واتـا : مرۆڤ تەنهـا ئەوەی هەوڵی بۆداوە بۆی دەمێنێتەوە ، هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت : (*فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـــالِحًا*)[8]واتا : ئەوەی ئاواتەخوازە بگاتە دیداری خودا با کاری چاکە ئەنجام بدات ، هەروەها دەفەرموێت ( جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِـــبُونَ )[9]واتا : پاداشـــتی ئەوەی بەدەســـتیان دەهێنا ، هەروەها دەفەرموێت ( إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّـــالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا)[10]واتا : ئەو کەســـانەی ئیمانیان هێناوە و کاری چاکەیان کردووە فیردەوس بۆیان دەبێتە مەنزڵگا ، هەروە ها دەفەرمو ێت : (إِلَّا مَن تَـابَ وَآمَنَ وَعَمِـلَ عَمَلًا صَـــالِحًا) وا تا : جگە لەوانەی تەوبەدەکەن و ئیمان دەهێنن و کاری چاکە ئەنجام دەدەن .**

---

[6] دوو دەرمانن بەکاردێن بۆ چارەسەری تای زەردویی
[7] النجم : ٣٩
[8] الكهف : ١١٠
[9] التوبة : ٨٢
[10] الكهف : ١٠٧

**چی دەڵێیت لەسەر ئەم حەدیثانە ؟** (بنيَ الإسلامُ علَى خمسٍ شهادةِ أن لا إلَه إلَّا اللهُ وأنَّ محمدًا رسولُ اللهِ وإقامِ الصلاةِ وإيتاءِ الزَّكاةِ وصومِ رمضانَ وحجِّ البيتِ) **واتا : ئیسلام لەسەر پێنج شت دامەزراوە ئەویش شاهیدی دانە بەوەی جگە خودا هیچ پەرستراوێک نیە و محمد پێغەمبەر و نێردراوی خودایە و ئەنجامدانی نوێژ و پێدانی زەکات و بەڕۆژوو بون لە ڕەمەزان و حەجکردن**

**ئیمان - باوەڕیش : وتنە بە زمان ، ڕاستگۆییە لە دڵەوە ، کارکردنە بە پایەکان**

**ڕێنیشاندەری کارەکانیش زیاترە لەوەی بژمێردرێت ، هەرچەندە بەندە دەچێتە بەهەشت بە فەزڵ و لوتفی خودا ، بەڵام دوای ئەوەی کە ئامادەبێت بە عیبادات و پەرستشەکانی ، چونکە ڕەحمەتی خودا نزیکە لە چاکەکاران .**

**ئەگەر بشوترێت : دەگات بە تەنها هەبوونی باوەڕ**

**دەڵێین : بەڵێ ، بەڵام کەی دەگات ؟ چەند بەربەست دێتە ڕێگای تا دەگات ؟ یەکەم بەربەستیش : بەربەستی ئیمانە : ئایا سەلامەت دەبێ لە لێسەندنەوە ؟ یاخود نا ؟ ئەگەر بگا ئەوا نەدار و بێ هیوا دەبێت .**

**حەزرەتی شێخ حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی : خودای گەورە بە بەندەکانی دەڵێت لە ڕۆژی دواییدا : بچنە ناو بەهەشت بە ڕەحمەتی من و دابەشی بکەن بە ئەندازەی کردەوەکانتان.**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**ئەگەر کردەوە و کار نەکەیت پاداشتیش نادۆزیتەوە .**

**دەگێڕنەوە پیاوێک لە بەنی ئیسرائیل حەفتا ساڵ خودای پەرست ، خودای گەورەش ویستی نیشانی فریشتەکان بدات چەند خۆڕاگرە ، فریشتەیەکی بۆ نارد کە پێی بڵێ کە سەرەڕای ئەو هەموو پەرستشە شایستەی ئەوە نیە بچێتە بەهەشت ، کاتێک پێی ڕاگەیاند ، خودا پەرستەکە وتی : ئێمە بۆ پەرستن**

---

١١ البخاري - ٨

دروست کراوین ، پێویستە لەسەرمان بیپەرستین ، کاتێک فریشتەکە گەڕایەوە ، خودای گەورە فەرمووی : بەندەکەم چی وت ؟ فریشـــتەکە وتی خودایە تۆ زاناتری بەوەی وتی ، خودای گەورە فەرمووی : ئەگەر ئەو پشـــت لە پەرســـتنمان نەکات ، ئێمەش واناکەین م ئەی فریشتەکان شایەت بن کە لێی خۆشبووم.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمویت : (حاسِبوا أنفسَكم قبل أن تُحاسَبوا ، وزِنوا أعمالكم قبل أن تُوزنوا ) واتا : لێپێچینەوە لە خۆتان بکەن پێش ئەوەی لێتان بکرێ ، کارەکانیشتان بپێون ، پێش ئەوەی بپێورێن .

حەزرەتی عەلی (ڕەزای خودای لێبێت) دەفەرمویت : هەرکەس وابزانێت بەبێ ماندوو بون دەگات ئەوە پشتگوێی خستووە.

حەزرەتی شـــێخ حەســـەنی بەصـــری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرمویت : داواکردنی بەهەشـــت بەبێ کردەوە گوناهێکە لە گوناهەکان ، فەرمووشـــی : نیشانەی حەقیقەت وازهێنانە لە سەرنجدانی کردەوە نەک وازهێنان لە کردەوە

پێغەمبەرمانﷺدەفەرمویت:( الكيسُ منْ دانَ نفسَهُ، و عملَ لمَا بعدَ الموتِ، و العاجزُ منْ أَتْبَعَ نفسَهُ هواهَا، و تمنَّى على اللهِ الأمانيَّ )[13]واتا : کەسی هۆشیار ئەوکەسەیە کە گوێڕایەڵی خۆی بێت و کاربکات بۆ دوای مردن ، بێ دەسەڵاتیش ئەو کەسەیە کە شوێن هەوا و ئارەزووی خۆی بکەوێت و ئاوات لە خودا بخوازێ .

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

چەند شـــەوت بە دووبارەکردنەوەی زانســـت و ســـەیرکردنی کتێب زیندوو کردەوە ، خەوت لەخۆت حەرام کرد ، نازانم ئامانج لەمە چی بوو ؟

ئەگەر نیەتت بەدەســـتهێنانی فراوانی دونیایە و بەدەســـتهێنانی خەڵک و پلە و پایە و خۆدەرخستن بەسەر نمونە و هاوشێوەکان ، وەیل[14]بۆت ، وەیل بۆ تۆ

---

[12] الأربعون الودعانية - ٢٢
[13] الجامع الصغير - ٦٤٥٠
[14] دۆڵێکە لە دۆزەخ

ئەگەریش مەبەســـتــت پێی زینــدوو کردنەوەی شــــەریعەتی پێغەمبەرە ﷺ و ڕێکخستنی ئەخلاقت ، و شکاندنی نەفسی ئەمرکەر بە خراپە ، خۆزگە بە تۆ ، خۆزگە بە تۆ ، ڕاستی فەرمووە شاعیر کە دەڵێ :

سهر العيون لغير وجهك ضائع

وبكاؤهن لغير فقدك باطل[15]

{شەونخونی چاوەکان بۆ غەیری ڕووی تۆ بەفیڕۆ چوونە و گریانیان بۆ غەیری تۆ بەتاڵە)

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

چەند دەتەوێت بژی هەر دەمریت ، کێت دەوێ خۆشت بوێ هەر لێی جیادەبیتەوە ، هەر کارێکیشت دەوێ بیکە پاداشتەکەی وەردەگریت لەسەری .

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

هەرشــتێک کە دێتە ڕێت لە بەدەســتهێنانی زانســـتی قســـەکردن و ناکۆکی و پزیشـــکی و دیوانەکان و شــیعر و ئەســـتێرەکان و کێشــــی شــــیعری و نەحو و تەصریف : لەدەســت دانی تەمەنە و هیچی تر ئەگەر پێچەوانەی خودا بێت ، من لە ئینجیلدا بینیومە کە حەزرەتی عیســا (ســەلامی خودای لێبێ) فەرموویەتی : لەو ســاتەی مردوو دەخرێتە ســەر شــان هەتا دەخرێتە ناو گۆڕ ، خودای گەورە بە گەورەیی خۆی چل پرســـیاری لێدەکات ، یەکەم : دەفەرموێت : (بەندەکەم ، ڕوانینیت جوان کرد بۆ بونەوەرەکان ســـالانێکە ، نەتتوانی جوان بڕوانیتە من بۆ ساتێک) ، هەموو ڕۆژێک خودای گەورە سەیری دڵت دەکات و دەفەرموێت : ئەوە چی دەکەیت بۆ غەیری من ، لەکاتێکدا دەورەدراویت بە خێری من)!! بەڵام تۆ کەڕیت و نایبیستیت؟!!!

[15] شەونخونی چاوەکان بۆ جگە ڕووی تۆ لەدەست دانە ، گریانیشیان بۆ جگە لە تۆ بەتاڵە

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**زانست بەبێ کردەوە شێتیە ، کردەوەش بەبێ زانست نابێت**

**بشزانە کە زانستێک ئەمڕۆ لە گوناهێ نەتپارێزێت ، هەڵتنەگرێت بۆ پەرستش ، سبەی ناتوانێ دوورت بخاتەوە لە ئاگری دۆزەخ ، ئەگەر ئەمڕۆ کار نەکەیت ، نەگەیتەوە بە ڕۆژەکانی پێشوو ، سبەی لە ڕۆژی دوایی لەوکەسانە دەبیت کە دەڵێن : (فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا)[16]واتا خودایە بمانگەڕێنەوە کاری باشە بکەین ، پاشان پێێ دەوترێت : ئەی گەمژە تۆ لەوێوە دێیت.**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**هیمەت بۆ ڕوحت دابنێ و بەزاندن بۆ نەفست و مردن بۆ لاشەت ، چونکە ماڵی تۆ گۆڕە ، خەڵکی گۆڕستانیش لەهەموو ساتێکدا چاوەڕوانتن کە کەی دەگەیتە لایان ، نەکەی نەکەی بەبێ پێداویستی سەفەر بگەیتە لایان .**

**حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خودای لێبێت) دەفەرموێت : ئەم جەستانە زیندانی باڵندەکانن ، شوێنی ولاخەکانیشە ، بیر لەخۆت بکەرەوە کامیان تۆیت ؟**

**ئەگەر لە باڵندە ئاسمانیەکان بیت ئەوا کاتێک دەنگی زرەنگاندنەوەی (ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ)[17]واتا : بگەڕێرەوە بۆ لای خودا ، دەفڕیت بۆ ئاسمان و دەچیت لە بەشە بڵندەکانی بەهەشت دەنیشیتەوە ، وەک پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت : (اهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ لِمَوْتِ سَعْدِ بنِ مُعَاذٍ)[18]واتا : عەرشی ڕەحمان بۆ مردنی سەعدی کوڕی معاذ هەژا و لەرزی .**

---

[16] السجدة : ١٢
[17] الفجر :٢٨
[18] صحيح البخاري - ٣٨٠٣

پەنا بەخودا ئەگەر لە وڵاخەکانیش بیت وەک خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾[19] واتا : ئەوان وەک ئاژەڵن بەڵکو خراپتریش ، هەر بۆیە گواستنەوەکەت لەماڵەوە با بۆ قوڵایی ئاگر نەبێ .

لە حەزرەتی شێخ حەسەنی بەصریەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت ) دەگێڕنەوە : پەرداخێک ئاوی ساردی پێ درا ، کاتێک پەرداخەکەی وەرگرت بورایەوە و کەوتە سەر زەوی و پەرداخەکە لە دەستی کەوت ، کاتێک بەهۆش هاتەوە پێی وترا : ئەوە چیت بەسەر هات باوکی سەعید ؟ فەرمووی : ئاوات و داخوازی خەڵکی دۆزەخم بەبیر هاتەوە کە بە خەڵکی بەهەشت دەڵێن : (أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ)[20] واتا : ئاوێکمان بەسەردا بڕژێنن یان لەوەی خودا پێی بەخشیون .

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

ئەگەر بەتەنها زانست بۆت بەس بوایە و پێویستی بە کردەوە نەبوایە لەگەڵی ، ئەوکات بانگەوازی خودا بێ سوود دەبوو کە دەیفەرموو : (هلْ مِن مُستَغْفِرٍ؟ هلْ مِن تائِبٍ؟ هلْ مِن سائِلٍ؟ )[21] واتا : ئایا کەس هەیە داوای لێخۆشبوون بکا ؟ ئایا کەس هەیە تەوبەی کردبێت ؟ ئایا کەس هەیە داواکاری هەبێت ؟

دەگێڕنەوە کۆمەڵێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان (ڕەزای خودایان لێ بێت) باسی عبداللە ی کوڕی عومەریان کرد لای پێغەمبەری خودا ﷺ و ئەویش فەرمووی : (نِعْمَ الرَّجُلُ عبدُ اللَّهِ لو كانَ يُصَلِّي باللَّيْلِ)[22] واتا : ئەو بەڕاستی پیاو و مەردە ئەگەر شەو نوێژ بکات

هەروەها سەڵەوات و سەلامی خودای لەسەر بێت بە پیاوێک لە هاوەڵانی دەفەرموێت : (یا فلان .. لا تکثر النوم باللیل فإن کثرة النوم باللیل تدع صاحبه فقیرا یوم القیامة )[23] واتا : ئەی فلان .. شەوانە زۆر مەخەوە چونکە زۆر خەوتن خاوەنەکەی بە هەژار دەهێڵێتەوە ڕۆژی قیامەت.

---

[19] الأعراف : ١٧٩
[20] الأعراف : ٥٠
[21] صحيح مسلم - ٧٥٨
[22] صحيح البخاري - ٣٧٣٨
[23] الترغيب و الترهيب - ٤٤٦

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

(وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ)[٢٤]فەرمانە ، (وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ)[٢٥]سوپاسگوزاریە ، (وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ)[٢٦]زیکرە .

فەرموویەتی (صلى الله عليه وسلم) : (( ثلاثة أصوات يحبها الله تعالى. صوت الديك، وصوت الذي يقرأ القرآن، وصوت المستغفرين بالأسحار)) واتا : سێ دەنگ هەیە خودای گەورە پەسەندی فەرمووە ئەوانیش دەنگی کەڵەشێر و دەنگی ئەوکەسەی قورئان دەخوێنێت و ئەو کەسەی داوای لێخۆشبوون دەکات لە نیوە شەودا. متمانەت بە خودای گەورە هەبێت

حەزرەتی سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێت ( خودای گەورە بایەکی هێناوەتە بوون کە لە نیوەشەودا دەشنێت و زیکر و داوای لێخۆشبونەکان هەڵدەگرێت بۆ پادشای بەتوانا (الملک الجبار).

هەروەها فەرموویەتی : ئەگەر سەرەتای شەو بوو بانگەوازکارێک بانگەواز دەکات لە ژێر عەرشدا : دەسا با خودا پەرستەکان هەستن ، هەڵدەستن و نوێژ دەکەن ئەوەندەی خودا بیەوێ ، پاشان بانگەوازکارێک لە ناوەڕاستی شەودا بانگەواز دەکات : دەسا با ئەوانەی داوای لێخۆشبوون دەکەن هەستن ، هەڵدەستن و داوای لێخۆشبوون دەکەن ، ئەگەر بەرەبەیان دەرکەوت بانگەوازکارێک بانگەواز دەکات : دەسا با غافڵەکان هەستن ، هەڵدەستن لە جێگایاندا وەک ئەو مردووانەی کە لە گۆڕەوە زیندوو بوبنەوە.

---

[٢٤] الإسراء : 79
[٢٥] الذاريات : ١٨
[٢٦] آل عمران : ١٧

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

لەهەندێک لە ئامۆژگاریەکانی لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی : ئەی کوڕەکەم .. با کەڵەشێر لەتۆ زیرەکتر نەبێت ، بانگ بکات لە نیوەشەودا و تۆ خەوتویت ،

جوانی فەرمووە ئەو کەسەی ئەم شعرەی وتووە :

لَقَد هَتَفَت في جُنحِ لَيلٍ حَمامَةٌ          عَلى فَنَنٍ وَهناً وَإِنّي لَنائِمُ
كَذَبتُ وَبَيتِ اللهِ لَو كُنتُ عاشِقاً          لَما سَبَقَتني بِالبُكاءِ الحَمائِمُ
وأَزعُمُ أَنّي هائم ذو صَبابَةٍ[27]          لربي فلا أَبكي وَتَبكي البَهائِمُ

واتا : لە تاریکی شەودا کۆترێک دەنگی دەرچوو لەسەر دارێکەوە و منیش خەوتووم ، سوێند بە ماڵی خودا من درۆم کردووە ئەگەر عاشق بوایەم کۆترەکە پێشم نەدەکەوت لە گریان ، وای دەردەخەم من شەیدا و عەوداڵی خودام لەکاتێکدا من ناگریم و ئاژەڵەکان دەگرین

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

پوختەی زانست : ئەوەیە کە بزانیت گوێڕایەڵی و پەرستن چیە ؟

بزانە کە گوێڕایەڵی و پەرستن شوێنکەوتنی ڕێدانەرە لە فەرمان پێکراوەکان و ڕێگری لێکراوەکان بە وتە و کردار ، واتا : هەموو ئەوەی دەیڵێیت و دەیکەیت ، هەروەها واز لە وتە و کردارێک بهێنیت کە تێیدا ئیقتیدا بێ بە شەرع ، وەک ئەوەی لە ڕۆژی جەژندا بەڕۆژوو بیت یان ڕۆژی جەژنەکان ئەوکاتە سەرپێچیکاریت ، یاخود ئەگەر لە جلێکی تەنکدا نوێژ بکەیت هەرچەندە وێنەدانەوەی پەرستنە بەڵام گوناهبار دەبیت .

---

[27] گەرم و گوڕی و پەرۆشی

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

پێویستە لەسەرت کە وتە و کردارت هاوڕای شەرع بێت ، کاتێک زانست و کارکردن بەبێ ئیقتیداکردن بە شەرع بێت گومڕاییە ، پێویستە لەسەرت کە بە قسە باق و بریق و شەطەحاتەکانی صۆفیەکان نەخەڵەتێیت ، چونکە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە لەڕێگای موجاهەدە و بڕینی شەهوەتی نەفس دەبێت و کوشتنی حەز و ئارەزووەکان بە خەنجەری ریازەتکێشی (ڕووبەڕووبونەوەی نەفس )، نەک بە قسە و شتی ناڕاست ،

هەروەها بزانە کە ئەو زمانەت کە لە دەرەوەیە و ئەو دڵەت کە لە ناوەوەیە پڕن لە غەفڵەت و شەهوەت نیشانەی سەرەڕۆییە ، هەتاکو نەفست نەکوژیت بە موجاهەدەکردنی ئەوا دڵت زیندوو نابێتەوە بە ڕووناکیەکانی عیرفان.

هەروەها بزانە کە هەندێک لەو بابەتانەت کە لە منت پرسی دەربارەیان وەڵامیانت دەستناکەوێ تەنها بە نوسین و قسە ، کە بگەیتە ئەو حاڵەتە دەزانیت چیە ! ئەگەرنا زانینیان لە شتە مەحاڵەکانە ، چونکە تامکردنە ، هەر شتێکیش کە تامکردن بێت ، ناوەستێت بەوەی وەسف بکرێت بە وتە ، وەک شیرینیەتی شتی شیرین و تاڵیەتی شتی تاڵ ، نازانرێن بەبێ تامکردن ، وەک دەگێڕنەوە لە کەسێکەوە کە ناتوانێت بچێتە لای ئافرەتان نامەی بۆ هاوڕێیەکی نوسی : پێم بڵێ تامی جوتبوون چۆنە ؟

ئەویش بۆی نوسی لە وەڵامدا : ئەی فلان ... من وامزانی تەنها ناتوانیت بچیتە لای ئافرەت ، ئێستا زانیم کە هەم نازانیت بچیتە لای ئافرەت و هەم بێعەقڵیشیت ، چونکە ئەم چێژە تامکردنە ، ئەگەر پێی بگەیت دەزانیت ، ئەگەرنا وەسفکردنی بە قسە و نوسین سودی نیە.

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

هەندێک لە بابەتەکانت لەم ڕوانگەیەوەیە ، هەندێکیشی کە وەڵامەکەی جێگیردەبێ باسمانکردووە لە (إحياء العلوم)[28] و کتێبەکانی تر ، لێرەشدا پوختەیەک لێی باس دەکەین و ئاماژەی بۆ دەکەین بۆیە دەڵێین چوار شت پێویستە لەسەر ئەوکەسەی دەبێتە ڕێبوار :

یەکەمیان : بیروباوەڕێکی ڕاست کە داهێنراوی تێدا نەبێت

و دووهەمیان : تەوبەیەکی دروست کە نەگەڕێتەوە بۆ شەرمەزاری .

و سێهەمیان : قەناعەت هێنان بە دوژمنەکان بۆ ئەوەی کەس حەقی بە سەرتەوە نەمێنێت

و چوارەم : بەدەستهێنانی زانستی شەریعەت بەو ڕێژەیەی بتوانێت فەرمانەکانی خودای گەورە جێبەجێ بکات.

پاشان لە زانستی ئاخیرەتدا ئەوەی بەهۆیەوە ڕزگاربوون بەدەست دەهێنرێت.

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی شیبلی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) کە خزمەتی چوارسەد مامۆستای کردووە ، و فەرموویەتی : چوار هەزار حەدیثم خوێندۆتەوە ، پاشان تەنها یەک حەدیثیانم هەڵبژارد ، و کارم پێکرد ، وجگە لەوەم نەکرد ، لەبەرئەوەی وێناییم دەکرد سەرفرازی و ڕزگاربوونی خۆم پێیەوە دۆزیەوە ، زانستی یەکەمینەکان ، و دواییینەکان هەمووی تێیدا ڕێزکرابوو و کیفایەت بووم بەوە ، ئەویش کە پێغەمبەرمان ﷺ بە هەندێک لە هاوەڵەکانی فەرموو : (اعمل لدنياك بقدر مقامك فيها ، واعمل لآخرتك بقدر بقائك فيها ، واعمل لله بقدر حاجتك إليه ، واعمل للنار بقدر صبرك عليها )[29] واتا : کار بۆ دونیات بکە بە ئەندازەی پلەوپایەت تێیدا ، و کار بۆ ئاخیرەتت بکە بەئەندازەی مانەوەت تێیدا ، و کار بۆ خودا بکە بە ئەندازەی پێویستیت پێی ، و کار بۆ ئاگر بکە بە ئەندازەی سەبر گرتنت لەسەری .

---

[28] ناوی کتێبەکەی ئیمامی غەزالی - # وەرگێڕ
[29] ئیمامی البیهقي گێڕاویەتیەوە

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

ئەگەر ئەم حەدیثەت زانی پێویستت بە زانستێکی زۆر نابێت .

هەروەها بڕوانە لە بەسەرهاتێکی تردا . ئەویش : حەزرەتی حاتەمی ئەصەم لە هاوڕێی حەزرەتی شەقیقی بەڵخی بووە (ڕەحمەتی خودا لە هەردووکیان) . ڕۆژێک لێی پرسی : ماوەی سی ساڵ دەبێت هاوڕێیەتیم دەکەیت چیت دەستکەوت ؟

فەرمووی : هەشت سودم دەستکەوت لە زانست . کە لە زانست ئەوەندە بەسە بۆم چونکە من داواکاری ڕزگاربوون و سەرفرازیمم تێیدا .

شەقیق فەرمووی : چین ئەوانە ؟

حاتەم فەرمووی :

سودی یەکەم :

من سەیری بونەوەرانم کرد بینیم بۆ هەریەکێکیان خۆشەویست و ئەویندارێک هەیە . هەندێک لەوانیش خۆشەویستەکەیان هاوەڵیان دەبێت هەتا نەخۆشی مردن و هەندێک هاوەڵی دەبێ هەتا ناو گۆڕ . پاشان دەگەڕێتەوە و بەتەنها بەجێی دەهێڵێت و کەس لەگەڵیدا ناچێتە ناو گۆڕەوە

بیرمکردەوە و وتم : باشترین یار کە لەگەڵ کەسێکدا بچێتە ناو گۆڕەوە و تەسکینی پێ بدا جگە لە کاری چاکە هیچ نیە . بۆیە کردم بە یار بۆ خۆم . بۆ ئەوەی ببێت بە ڕۆشنکەرەوەیەک بۆ ناو گۆڕەکەم و تەسکینم پێ بدات . و بە تەنهایی نەمهێڵێتەوە

سودی دووەم :

من بینیم کە بونەوەرەکان شوێن حەز و ئارەزوویان دەکەون و هەنگاو بۆ ڕازیکردنی نەفسی خۆیان دەنێن . لە فەرمایشتی خودای گەورە وردبوومەوە کە دەفەرموێت : (وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى ۝ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى)[30] {واتا : ئەوەی لە خودا بترسێ و ڕێگە بە نەفسی نەدا شوێن حەز و ئارەزوو بکەوێ } دڵنیابوومەوە کە

---

[30] النازعات : ٤٠ ، ٤١

قورئان حەق و ڕاستگۆیە بۆیە هەنگاوم نا بۆ بێفەرمانیکردنی نەفسم و دژی وەستامەوە ، و شوێن حەز و ئارەزوەکانم نەکەوتم ، هەتا ڕازی بوو بە گوێڕایەڵی خودای گەورە .

سودی سێهەم :

من بینیم کە هەموو کەسێک لە خەڵک هەوڵدەدات بۆ کۆکردنەوەی کالاکانی دونیا ، بەدەستیەوە دەیگرێت و منیش لەم فەرمایشتەی خودای گەورە ورد بوومەوە کە دەفەرمویت : (مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ)[31]{ئەوەی هەتانە نامێنێت و ئەوەی لای خودایە دەمێنێتەوە} منیش هەوڵم دا بۆ بەردەست خستنی بەرهەمەکەم بۆ ڕەزامەندی خودا و دابەشم کرد بەسەر هەژارەکاندا بۆ ئەوەی ببێتە گەنجینەیەک بۆم لەلای خودای گەورە

سودی چوارەم :

من بینیم کە هەندێک بونەوەر وادەزانن کە شەرەف و عیزەتیان بریتیە لە زۆری هۆز و عەشیرەتەکان و مایەی شانازیە بۆیان .

و هەندێکیش وایان نیشاندا کە سەرمایەی پارە و زۆری منداڵە ، بەمەش شانازیان پێوە کرد.

و هەندێکیش وایان دانا کە سەربەرزی و شەرەفیان لە دزینی پارەی خەڵک و زوڵم لێکردن لێیان و خوێن ڕشتنیان دایە .

تایەفەیەکیش وایان باوەڕ هەبوو کە لە زیادەڕۆیی کردن لە پارە و بەفیڕۆدانی دایە ، منیش وردبوومەوە لە فەرمایشتی خودا کە دەفەرمویت : (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)[32] {بەڕێزترینتان لای خودای گەورە لەخوداترسترینتانە } ، منیش لەخواترسێتیم هەڵبژارد ، و باوەڕم وابوو کە قورئان ڕاست و ڕاستگۆیە ، و گومان و پێزانینیان هەمووی بەتاڵە دەڕوا و نامێنێ .

---

[31] النحل : ٩٦
[32] الحجرات : ١٣

سودی پێنجەم :

من بینیم خەڵک زەمی یەکتر دەکەن و غەیبەتی یەکتر دەکەن[٣٣] بینیم بناغەی ئەوە لە ئیرەیی بردن بە پارە و پلە و پایە و زانست سەرچاوە دەگرێت ، بۆیە وردبوومەوە لە فەرمایشتی خودای گەورە : (نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا)[٣٤]{ئێمە ڕەحمەت و لوتفمان بەشکردووە لە ناویاندا لە ژیانی دونیادا} ، بۆیە زانیم کە دابەشکردنەکە لەلایەن خودای گەورە بووە لە ئەزەلدا ، بۆیە هەرگیز ئیرەییم بە کەس نەبرد و ڕازی بووم بە دابەشکردنەکەی خودای گەورە .

سودی شەشەم :

بینیم خەڵک دوژمنایەتی یەکتر دەکەن لەبەر مەبەست و هۆکارێک ، بۆیە وردبوومەوە لە فەرمایشتی خودای گەورە : (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا)[٣٥]{شەیتان دوژمنە بۆتان بۆیە بە دوژمنی دابنێن} ، بۆیە زانیم کە دروست نیە دژایەتی کەسی تر بکرێت جگە لە شەیتان .

سودی حەوتەم :

من بینیم کە هەموو کەسێک بە جدی هەوڵ دەدات ، ماندوو دەبێت بە زیادەڕۆییەوە بۆ داواکاردنی بەشە خۆراک و پارە ، بەشێوەیەک کە دەکەوێتە ناو گومان و حەرام و خۆی زەلیل دەکات و لە بەهای خۆی کەم دەکاتەوە ، بۆیە وردبوومەوە لە فەرمایشتی خودای گەورە : (وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا)[٣٦]{هیچ بونەوەرێک نیە لەسەر زەوی کە ڕزقی لەلایەن خوداوە نەبێت} ، بۆیە زانیم کە ڕزقم لەلای خودایە و گەرەنتی کردووە ، بۆیە سەرقاڵبووم بە پەرستش ، و چاوچنۆکی خۆمم بڕی لەوانەی غەیری ئەون .

---

[٣٣] غەیبەت : باسکردنی براکەت بەوەی پێی ناخۆشە
[٣٤] الزخرف : ٣٢
[٣٥] فاطر : ٦
[٣٦] هود : ٦

**سودی هەشتەم :**

**من بینیم کە هەموو کەسێک پشتی بە شتێکی دروستکراو بەستووە ، هەندێکیان بە دینار و دەرهەم ، و هەندێکیان بە پارە و سامان ، و هەندێکیان بە پیشە و کار ، و هەندێکیان بە دروستکراوی وەک خۆی ، بۆیە وردبوومەوە لە فەرمایشتی خودای گەورە :** (وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا)[٣٧] **{ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت بەس دەبێت بۆی ، خودای گەورە کارەکانی بۆ جێبەجێ دەکات ، خودای گەورە بۆ هەموو شتێک قەدەرێکی داناوە } ، بۆیە پشتم بە خودا بەست ئەو بۆ من بەسە و باشترین وەکیلە .**

**شەقیق فەرمووی : خودای گەورە سەرفرازت بکات من لە تەورات و ئینجیل و زەبور و فورقان {قورئان} گەڕام ، بینیم چوار کتێبەکە دەسوڕێنەوە لە دەوری ئەم هەشت سوودە ، ئەوەی کاری پێ بکات وەک ئەوە وایە کاری بەم چوار کتێبە کردبێت .**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**ئێستا لەم دوو بەسەرهاتە زانیت کە تۆ پێویستت بە فراوانکردنی زانست نیە ، و ئێستا بۆت بەیان دەکەم کە چی پێویستە لەسەر ڕێبواری ڕێگای حەق :**

**بزانە کە پێویستە بۆ ڕێبوار کە شێخێکی ڕێنیشاندەری پەروەردەکاری هەبێت ، بۆ ئەوەی ڕەوشتە خراپەکان دەربهێنێت تێیدا بە پەروەردەکردنی ، و لە شوێنی ئەودا ڕەوشتێکی چاک بخاتە جێگای .**

**مانای پەروەردەش لە کاری جوتیارێک دەچێت کە دڕکەکان لێدەکاتەوە ، و ڕووەکە خراپەکان دەردەهێنێت لە نێوان چاندراوەکاندا بۆ ئەوەی ڕووەکەکانی چاک بن ، و گەشەکردنیان تەواو بێت ، پێویستە ڕێبوار شێخێکی هەبێت پەروەردەی بکات و ڕێنوێنی بکات بۆ ڕێگای خودای گەورە چونکە خودای گەورە نێردراوێکی نارد بۆ بەندەکان تا ڕێنماییان بکات بۆ ڕێگاکەی و ئەگەر ئەو ﷺ ڕۆیشتبێت**

---

[٣٧] الطلاق : ٣

ئەوا جێنشینەکانی لە جێگای خۆی بەجێ هێشتووە ، بۆ ئەوەی ڕێنمایی بکەن بەرەو خودای گەورە .

و مەرجی ئەو شێخەی کە شیاوە کە ببێتە جێگری پێغەمبەر سەڵەواتی خودا و سەلامی لەسەر بێت : ئەوەیە کە زانا بێت سەرەڕای ئەوەی کە هەموو زانایەکیش شیاوی جێنشینی نیە .

و من بۆت بەیان دەکەم هەندێ لە نیشانەکانی بە شێوەیەکی گشتگیر : بۆ ئەوەی هەموو کەس بانگەشەی ئەوە نەکات کە مورشیدە دەڵێین : ئەوەی پشت لە حەزی دونیا و حەزی پلەو پایە دەکات ، و شوێن شێخێکی چاوکراوە کەوتبێت کە چاودێری کردنەکەی بە زنجیرە بگەڕێتەوە بۆ گەورەی پێغەمبەران ﷺ و بە باشی ڕاهێنانی بە نەفسی خۆی کردبێت لە کەم خواردن و وتن و خەوتن و لە زۆر سەڵەوات دان و بەخشین و بەڕۆژووبوون ، و بە چاودێریکردنی بۆ شێخە چاوکراوەکەی وای لێکردبێت کە ڕەوشتی جوان تێیدا ڕەنگ بداتەوە : وەک سەبر و نوێژ و سوپا سگوزاری و پشت بە ستن و دڵنیایی و دە ست کراوەیی و قەناعەت و دڵنیابوونەوە لە نەفس و ژیری و خۆ بەکەمزانی و زانست و ڕاستگۆیی و شەرم و وەفا و هەیبەت و جێگیری و لەسەرخۆیی و نمونەی تری هاوشێوەی ، ئەوکاتە ئەو نورێکە لە نوورەکانی پێغەمبەر ﷺ کە شیاوە بەدواکەوتنی ،بەڵام هەبوونی نمونەی ئەوە زۆر دەگمەنە و کەمترە لە گۆگردی سوور .

ئەوەی خۆشبەختی یاوەری بێت و شێخێک بدۆزێتەوە لەوەی باسمان کرد ، و شێخەکەش قبوڵی کرد ، پێویستە بە ئاشکرا و پەنهانیش ڕێزی بگرێت :

سەبارەت بە ڕێزگرتنی ئا شکرا ئەوەیە کە دەمەقاڵەی لەگەڵ نەکات ، و سەرقاڵ نەبێت بە دەمەقاڵێ لەگەڵی لەهەموو بابەتێکدا تەنانەت ئەگەر بەهەڵەکەشی زانی ، و بەرماڵەکەی ناخاتە بەردەمی تەنها لە کاتی ئەنجامدانی نوێژ نەبێت ، ئەگەر لە نوێژ تەواوبوو هەڵی دەگرێت ، و لە سونەتەکانی نوێژ زۆر ئەنجام نادات لە خزمەتیدا ، و ئەوە دەکات کە شێخەکە فەرمانی پێکردووە لە کار بەپێی توانا و تاقەتی .

سەبارەت بە ڕێزگرتنی پەنهان : بریتیە لەوەی کە هەموو ئەوەی دەیبیستێت و لێی قبوڵ دەکرێت لە ئاشـــکرادا ئینکاری لێ نەکات نە بە کردار و نە بە قســـە ؛ بۆ ئەوەی دووڕوویی توش نەبێت ، و ئەگەر نەیتوانی ئەوە واز لە هاوەڵێتی دەهێنێت هەتاکو ئاشکرا (ڕووکەش) و پەنهان (ناخ)ی یەک دەگرنەوە .

خۆی بپارێزێت لە دانیشـــتن لەگەڵ خراپەکـار ؛ بۆ ئەوەی دڵی بەدووربێت لە کاریگەریەکانی شـــەیتانەکانی جنۆکە و ئینســـان ، بەمەش خاوێن دەبێتەوە لە پیســـیەکانی شـــەیتان ، و لەهەموو بارودۆخێکدا هەژاری هەڵدەبژێرێت بەســـەر دەوڵەمەندی .

پاشـــان بزانە کە تەصـــەوف دوو تایبەتمەندی هەیە : ڕاســـتبوونەوە ، و هێمنی لەگەڵ بەدیهێنراوەکان ، ئەوەی ڕاســـتببێتەوە و خوڕەوشـــتی لەگەڵ خەڵک باش بێت بە ژیریی ئەوا (صۆفیە) .

و ڕاستبوونەوە : ئەوەیە کە بەختی خۆی فیدا بکات بۆخۆی.

و شـیاو مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵک : ئەوەیە کە ویسـتی خۆت بەسـەر خەڵکەوە هەڵنەگریت ، بەڵکو خۆت هەڵبگریت لەسەر ویستی ئەوان بەوەی کە پێچەوانەی شەرع نەبێت .

- پاشان تۆ پرسیارت لێکردم سەبارەت بە بەندایەتی و ئەویش سێ شتە :

یەکەمیان : پاراستنی فەرمانی شەرع .

دووهەمیان : ڕازی بوون بە قەزا و قەدەر و قیسمەتی خودای گەورە .

ســـێهەمیان : وازهێنان لە ڕازیکردنی خۆت لەپێناو داواکردنی ڕەزامەندی خودای گەورە .

- و پرسیارت لێکردم سەبارەت بە تەوەکول {پشت بەستن} ؟

ئەویش بریتیە لەوەی کە باوەڕت بە خودای گەورە پتەو بکەیت لەوەی کە بەڵێنی داوە ، واتا باوەڕت وابێت کە ئەوەی لە قەدەرت بێت بێ گومان بۆت دێت ئەگەرهاتوو

تەنـانـەت هـەمـوو جیـهـانـیش هـەوڵـی لابردنـی بـدەن لـە ڕێـگـات ، ئەوەشـــی بۆت نەنوسـراوە نـاگـات پێـت ، ئەگـەرهـاتـوو تـەنـانـەت هـەمـوو جیـهـانـیش یـارمـەتیت بـدەن .

- و پرسیارت لێکردم سەبارەت بە دڵسۆزی ؟

ئەویش بریتیە لەوەی هەموو کارەکانت لەپێناو خودای گەورە بێت ، و دڵت ڕەحەت نەبێت بە ستایشی خەڵک ، و گوێ نەدەیت بە تانە دانیان .

و بزانە کە ڕیا {خۆدەرخستن} پەیدا دەبێت لە بەگەورەدانانی بونەوەرەکان .

و چارەسەرەکەی ئەوەیە کە وا سەیریان بکەیت کە لەژێر فەرمانی قودرەتێکن ، و وەک ئەو شـــتە بێگیانانە دایانبنێیت کە لەتوانایان نەبێت ئارامی و ناڕەحەتیت پێبگەیەنن بۆ ئەوەی ڕزگارت بێت لە ســـتایشـــیان ، و هەرکات بەوە داتنان کە خاوەن قودرەت و ئیرادەن ئەوا ڕیا لێت دوور ناکەوێتەوە .

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

و ئەوەی ماوەتەوە لە پرسیارەکانت بە شێکی باسم کردووە لە دانراوەکانم ، داوای بکە ؛ و نوســـینی هەندێکی حەرامە ، تۆ کار بەوە بکە کە دەیزانیت ، بۆ ئەوەی ئەوەت بۆ ئاشـــکرا ببێت کە نایزانیت ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (من عَمِل بما عَلِم، ورَّثَه اللهُ عِلْمَ ما لم يَعْلَم ) [٣٨]{ئەوەی کار بەو شـــتە بکات کە دەیزانێت ، خودای گەورە زانینی ئەوەی پێ دەبەخشێ کە نایزانێ } .

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

لەمڕۆ بەدواوە پرسیاری ئەوانەم لێ مەکە کە لات بوونە بە گرێ و ئیشکال مەگەر بە زمانێکی شـــاراوە نەبێت ، خودای گەورە دەفەرموێت : ( وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ

---

[٣٨] عێراقی لە (تخريج أحادث الإحياء) 71/1 دەفەرموێت : ئەبو نەعیم دەری هێناوە لە (الحلية) لە حەدیثی ئەنەسەوە و ضەعیفی کردووە .

خَيْرًا لَهُمْ)[39]{ئەگەر ئەوانە سـەبريان بگرتايە هەتا بۆيان دەهاتيتە دەر ئەوە باشـتر بوو بۆ ئەوان } .

و ئامۆژگاريەكەی حەزرەتی خدر سەلامی خودای لەسەربێت وەربگرە كە فەرمووی : ( فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا )[40]{هيچم لێ مەپرسە هەتا خۆم لەسەری بۆتی باسدەكەم} .

و پەلە مەكە هەتا كاتی خۆی دێت بۆت دەردەكەوێت و دەيبينيت : ( سَأُرِيكُمْ آيَاتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ )[41]{نيشانەكانمتان نيشان دەدەن بۆيە پەلە مەكەن} .

بۆيە پێش كاتی خۆی پرسـيارم لێمەكە ، و دڵنيابە لەوەی ناگەيت تەنها بە ڕۆيشتن نەبێت كە خودای گەورە دەفەرموێت : ( أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا )[42]{ئايا بە سەر زەويدا نەڕۆيشتن و سەير بكەن} .

## ئەی ڕۆڵەكەم ..!!

بەخودا ئەگەر بڕۆيت سـەيروسـەمەرە دەبينيت لە هەمووماڵێك ، خۆت ماندوو بكە ؛ وەك حەزرەتی ذوالنونی ميسـڕی ڕەحمەتی خودای گەورە لێبێت بە يەكێك لە خوێندكارەكانی فەرمووی : ئەگەر توانيت خۆت ماندوو بكەيت ئەوە وەرە ، ئەگەرنا خۆت بە بێمانايی صۆفيەكان سەرقاڵ مەكە .

## ئەی ڕۆڵەكەم ..!!

من ئامۆژگاريت دەكەم بە هەشـت شـت ، لە منی وەرگرە بۆ ئەوەی زانسـتەكەت ڕووبەڕووت نەبێتەوە لە ڕۆژی قيامەتدا ، كار بە چوار دانەيان دەكەيت ، و واز لە چواريان دەهێنيت :

---
[39] الحجرات : ٥
[40] الكهف : ٧٠
[41] الأنبياء : ٣٧
[42] الروم : ٩

ئەوانەی کە وازیان لێ دەهێنیت :

یەکەمیان : دیبەیت لەگەڵ کەس مەکە لە بابەتێک هەتا دەتوانیت چونکە کێشەی زۆرە ، زیانەکەی زۆرترە لە سوودەکەی ، بەوەی کە سەرچاوەیە بۆ هەموو ڕەوشتێکی خراپی وەک ڕیا و ئیرەیی و لوتبەرزی و کینە و دژایەتی و خۆهەڵکێشان و هی تریش .

بەڵێ ئەگەر بابەتێک کەوتە نێوان تۆ و کەسێک یان قەومێک ، و ویستت وابوو کە حەق نیشان بدەیت و نەفەوتێت ، ئەوا لێکۆڵینەوە بۆت پە سەندە ، بەڵام ئەو ویست و ئیرادەیە دوو نیشانەی هەیە :

یەکەمیان : جیاوازی نەکەیت لەوەی کە حەق دەرکەوێت لەسەر زمانت یان زمانی غەیری خۆت .

دووهەمیان : لێکۆڵینەوەکە بە تەنهایی پێت خۆشتر بێت وەک لەوەی لەبەردەم خەڵکێک .

و گوێ بگرە وا من لێرەدا سودێکت بۆ باس دەکەم ، و بزانە کە پرسیارکردن لە کێشەکان بریتیە لە نیشاندانی نەخۆشی دڵ بە پزیشک ، و وەڵامیش بۆ ئەوە هەوڵدانەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە .

و بزانە کە نەزانەکان : دڵ نەخۆشەکانن ، و زاناکان : پزیشکەکانن .

و زانای نا کامڵ ناتوانێت بە باشی چارەسەر بکات ، و زانای کامڵ ناتوانێت هەموو نەخۆشێک چارەسەر بکات ، بەڵکو ئەوانە چارەسەر دەکات کە ئەگەری چارەسەر و چاکبوونەوە تێیاندا هەبێت ، خۆ ئەگەر گرفتەکە درێژخایەن بوو یان نەزۆک بوو ئەوا چارەسەر قبوڵ ناکات ، لێهاتوویی پزیشک لەوەیە کە بڵێ : ئەمە چارەسەر ناکرێت ، و سەرقاڵ نەبێت بە چارەسەرکردنی چونکە ئەمە بەفیڕۆ بردنی تەمەنە .

پاشان بزانە کە نەخۆشی نەزانین چوار جۆرە : یەکێکیان قابیلی ئەوەیە چارەسەر بکرێت ، و ئەوانەی تر چارەسەر ناکرێن .

**ئەوەی کە چارەسەر قبوڵ ناکات :**

**یەکەمیان : ئەوەی کە پرسیارکردن و ڕێگەگرتنەکەی بەهۆی ئیرەیی یاخود کینە بێت ، چەند بە وەڵامێکی با شتر و پاراوتر و ڕوونتر وەڵامی بدەیتەوە ، تەنها کینە و دژایەتی و ئیرەیی لەلای زیاتر دەکات ، ڕێگاکە ئەوەیە کە سەرقاڵ نەبیت بە وەڵامدانەوەی ، وەک وتراوە :**

**کل العداوة قد ترجى إزالتها إلا عداوة من عاداك عن حسد**

**{هەموو دوژمنایەتیەک لەوانەیە بتوانرێت لاببرێت**

**تەنها ئەو دوژمنایەتیە نەبێت کە دوژمنایەتیت بکا بە ئیرەیی}**

**بۆیە پێویستە خۆتی لێ لابدەیت ، و وازی لێ بهێنیت لەگەڵ نەخۆشیەکەی : خودای گەورە دەفەرموێت :** ( فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا)[٤٣]**{پشت بکە لەو کەسانەی پشتیان کردووە لە یادمان و تەنها ژیانی دونیایان دەوێت} .**

**و کەسی ئیرەیی بەر بە هەموو ئەوەی دەیڵێت و دەیکات ئاگر بەردەبێتە بەرهەمی زانستەکەی :** (الحَسَدَ يأكُلُ الحسَناتِ كما تأكُلُ النَّارُ الحَطَبَ )[٤٤] **{ئیرەیی لە چاکەکان دەخوات وەک چۆن ئاگر دار دەخوات}.**

**دووهەمیان : ئەوەیە کە کێشەکەی دەبەنگیەکەی بێت ، ئەمەش قابیلی چارەسەر نیە وەک حەزرەتی عیسا سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی : من بێدەسەڵات نەبووم بەرامبەر زیندووکردنەوەی مردوو ، بەڵام بێدەسەڵات بووم بەرامبەر چارەسەرکردنی دەبەنگ .**

---

[٤٣] النجم : ٢٩

[٤٤] عێراقی لە (تخريج أحادث الإحياء) **45/1** دەفەرموێت : ئەبو داود دەری هێناوە لە حەدیثی ئەبو هورەیرە . و بوخاری دەفەرموێت : دروست نیە ، و لەلای ئیبن ماجە لە حەدیثی ئەنەس هاتووە بە سەنەدێکی لاواز ، و لە تاریخی بەغداد بە سەنەدێکی حەسەن

**و ئەوەش کەسێکە کە سەرقاڵ دەبێت بە داواکردنی زانست بۆ ماوەیەکی کەم و شتێکی کەم لە زانستەکانی عەقڵ و شەرع فێردەبێت ، پرسیاردەکات ، و ڕێگەدەگرێت بە دەبەنگی خۆی لە زانایەکی گەورە ، کە تەمەنی لە زانستەکان بەسەربردووە : عەقڵی و شەرعی ، و ئەم دەبەنگە نازانێت ، و وادەزانێت ئەوەی لای بووە بە گرفت بەهەمان شێوە گرفتە لای زانا گەورەکە ، ئەگەر ئەمەندەی نەزانی ئەوا پرسیارەکەی لە دەبەنگ بوونیەتی ، پێویستە بە وەڵامدانەوەی سەرقاڵ نەبێت .**

**سێهەمیان : کاڵفام بێت ، و هەموو ئەوەی لە فەرمایشتی گەورەکان لێی تێنەگات دەخرێتە سەر کورتی تێگەیشتنی ئەو ، و پرسیارەکەی بۆ سوودمەندی بوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی بیری کۆڵە درک بە ڕاستیەکان ناکات ، نایەوێت سەرقاڵبوون بە وەڵامدانەوەی ئەویش ، وەک پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت : (** نَحْنُ مَعَاشِرَ الْأَنْبِيَاءِ أُمِرْنَا أَنْ نُكَلِّمَ النَّاسَ عَلَى قَدْرِ عُقُولِهِمْ **)[٤٥] {ئێمەی پێغەمبەران فەرمانمان پێکراوە کە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵک بکەین بە ئەندازەی تێگەیشتنیان}.**

**و ئەو نەخۆشیەی کە قابیلی چارەسەرە بریتیە لەوەی ڕێنمایی کراوێک بێت کە عاقڵێتی و تێگەیشتنی باشی هەبێت ئیرەیی و تووڕەیی و حەزی ئارەزوو و پلەو پایە و پارە نەبێت ، و داوای ڕێگای ڕاست بکات ، و پرسیارەکەی و ڕێگریەکەی لەبەر ئیرەیی نەبێت ، یاخود دەمارگیری و تاقیکردنەوە ، ئەمە قابیلی چارەسەرە ، دروستە سەرقاڵبوون بە وەڵامدانەوەی بەڵکو پێویستە لەسەرت وەڵامی بدەیتەوە .**

**دووەمیان کە وازی لێ دەهێنیت : پێویستە وشیار و ئاگادار بیت لەوەی کە ببیتە کەسێکی ئامۆژگاری کار ؛ چونکە سەختە مەگەر کاتێک کە کار**

---

**[٤٥] عێراقی لە (تخريج أحادث الإحياء) ٥٧/1 دەفەرموێت : گێڕاومانەتەوە لە بەشێک لە حەدیثی ئەبو بەکری کوڕی شخیر لە حەدیثی عومەر و لەلای ئەبو داو لە حەدیثی حەزرەتی عائیشە ( أنزلوا الناس منازلهم) { لەگەڵ خەڵک مامەڵە بکەن بەپێی پلە و پایەیان)**

بەوە بکەیت کە دەیڵێیت ، پاشـــان ئامۆژگاری خەڵکی پێ بکەیت ، بیربکەرەوە لەوەی بە حەزرەتی عیسا سەلامی خودای لەسەر بێت وترا : ئەی کوڕی مەریەم ئامۆژگاری خۆت بکە ، ئەگەر خۆت وەرتگرت خەڵکیش وەری دەگرێت ، ئەگەرنا شەرم لە خودا بکە .

ئەگەر بوویت بە ئامۆژگاری کار ئەوە ئاگاداری ئەم دوو تایبەتمەندیە ببە :

یەکەم : مەیخە ئەستۆت لە قسەکردندا هەندێک دەستەواژە و نیشانە و دێڕە شعر ؛ چونکە خودای گەورە خۆشەویستی خۆی نابەخشێت بەوانەی شتی زۆر دەخەنە ئەستۆیان ، و ئەو کەسانەی زیادەڕۆیی لە سنوری خۆیان دەکەن ، ئەوەش نیشانەی تێکچوونی ناوەوە و غافڵبوونی دڵە .

و مانای وەبیرهێنانەوە : ئەوەیە کە بەندە ئاگری ئاخیرەت بهێنێتەوە یادی خۆی ، و کەمتەرخەمی خۆی لە خزمەتکردنی خودا و بیربکاتەوە لە تەمەنی ڕابردووی کە بەفیڕۆی داوە لەوەی پەیوەندی بەوەوە نەبووە و بیر بکاتەوە لە ئەوەی لە بەردەستێتی لە بەربەست لە نەبوونی سەلامەتی ئیمان لە کۆتاییدا ، و حاڵی ئەو چۆن دەبێت لە کاتێک گیانی دەکێشرێت لەلایەن فریشتەی گیان کێشانەوە ، و ئایا دەتوانێت وەڵامی مونکەر و نەکیر بداتەوە ؟

و گرنگی بدات بە حاڵی خۆی لە قیامەت و وێستگەکانی ، و ئایا پرسی سیراط بە سەلامەتی تێدەپەڕێنێت یاخود دەکەوێتە چاڵەکەوە ؟

و یادکردنەوەی ئەم شتانە لە دڵیدا بەردەوام دەبێت ، بەمەش ناڕەحەتی دەکات لە بڕیارەکەی ، هەڵقولانی ئەم ئاگرانە ، و وەبیرهێنانەوەی ئەم کارەساتانە پێی دەوترێت وەبیرهێنانەوە ، و ئاگادارکردنەوەی بەدیهێنراوەکان و پێڕاگەیاندنیان بەم شتانە ، و ئاگادارکردنەوەیان لە کەموکورتی و زیادەڕۆییان ، و چاوکردنەوەیان بۆ عەیب و کەموکورتیەکانی خۆیان بۆ ئەوەی گەرمی ئەم ئاگرانە بەر

خەڵكی كۆڕ و مەجلیسەكە بكەوێت ، و بەهۆشیان بهێنێتەوە ئەم كارەساتانە بۆ ئەوەی قەرەبووی تەمەنی پێشوویان بكەنەوە بەپێی توانا ، و خەم و پەژارە دایان بگرێت بۆ ئەو ڕۆژە بەتاڵانەی بەبێ گوێڕایەڵی خودای گەورە بەڕێیان كرد .

ئەم ڕستەیە لەم ڕێگەیەدا پێی دەوترێت ئامۆژگاری كردن ، وەك چۆن كە دەبینیت لافاو هێرشی بردۆتە سەر ماڵی كەسێك ، و ئەوكەسە و خەڵكەكەی لەناویدان تۆش دەڵێیت : ئاگاداربن ئاگاداربن دەرباز ببن لە لافاوەكە !! ئایا دڵت ئەوە دەخوازێت كە لەم حاڵەتەدا هەواڵەكەت كە ئەرك خستنە سەر ئەستۆت بە دەستەواژە و نیشانەكانە بە خاوەنی ماڵەكە بڵێیت ؟ ئەو بەهیچ شێوەیەك حەزی پێناكات ؛ بەم شێوەیەشە حاڵی ئامۆژگاری كار بۆیە پێویستە خۆی لێ بەدوور بگرێ .

تایبەتمەندی دووەم : مەبەستت لە ئامۆژگاریەكەت لە مەجلیسەكەت دا ئەوە نەبێت كە بەدیهێنراوەكان لە كۆڕەكەتدا هەڵسن و حاڵیان لێ بێت ، و پۆشاكیان بدڕن ؛ بۆ ئەوەی بوترێت : ئەمە باشترین كۆڕە ؛ چونكە ئەوە هەمووی مەیلە بۆ دونیا و ڕیایی ، و دروست دەبێت لە غەفڵەت و بێئاگایی ، پێویستە هەوڵ و هیمەتت ئەوەبێت كە خەڵك بانگ بكەیت لە دونیاوە بۆ ئاخیرەت ، و لە بێفەرمانیەوە بۆ گوێڕایەڵی ، و لە چاوچنۆكیەوە بۆ دونیا نەویستی ، و لە ڕەزیلیەوە بۆ بەخشندەیی ، و لە لوتبەرزیەوە بۆ تەقوا ، و ئاخیرەتیان لا خۆشەویست بكەیت ، و دونیایان لەلا ڕق لێكەر بكەیت ، و فێری زانستی پەرستن و دونیا نەویستیان بكەیت ؛ چونكە ئەوەی زاڵە بە سەر هەستەكانیان لادانە لە پەیڕەوی شەرع ، و هەوڵدانە بۆ ئەوەی كە خودای گەورە پێی ڕازی نیە ، و سەرقاڵبوون بە ئاكاری خراپەوە ، بۆیە ترس بخەرە دڵەكانیانەوە ، و سەرسامیان بكە ، و ئاگاداریان بكەرەوە لەوەی بەرەو ڕویان دێت لە ترس ؛ بەڵكو سیفەتەكانی ناخیان بگۆڕێت ، و خەمخۆری تێیان دەربكەوێت ، و

حەز بە گوێڕایەڵی و گەڕانەوە لە بیفەرمانی ، و ئەمە ڕێگەی ڕێنوێنی و ئامۆژگاریە ، و هەموو ئامۆژگاریەک ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ئەوا قورساییەکە لەسەر شانی ئەوەی دەیڵێت و ئەوەی گوێی لێیەتی ، بەڵکو وتراوە : ئەوە شەیتانە ، بەدیهێنراوەکان لادەبات لە ڕێگادا و لەناویان دەبات ، بۆیە پێویستە لەسەریان لێی ڕابکەن ؛ چونکە ئەوەی تێکی دەدات لەلایەن کەسێکەوە لە ئاینی خۆیان بێت ، شەیتان ناتوانێت وەک ئەوە بکات ، و ئەوەی دەست و توانای هەبوو پێویستە لەسەر مینبەری موسوڵمانان دایبەزێنێت و ڕێگری لێبکات لەوەی دەری بڕیوە ؛ چونکە ئەوە دەچێتە چوارچێوەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە .

سێهەمیان کە وازی لێدەهێنیت : ئەوەیە کە تێکەڵاوی مەکە لەگەڵ پادشا و فەرمانڕەواکان و مەیانبینە ؛ چونکە بینینیان و دانیشتن لەگەڵیان و تێکەڵبوون لەگەڵیان نەهامەتیەکی گەورەیە ، و ئەگەر توشی بویت ئەوا گوێ بە ستایش و پیاهەڵدانیان مەدە ؛ چونکە خودای گەورە توڕەدەبێت ئەگەر ستایشی فاسق و زاڵم بکرێت ، و ئەوەی نزا بۆ زۆر مانەوەیان بکات ئەوا حەزی کردووە کە بێفەرمانی خودا بکات لەسەر زەویەکەیدا .

چوارەمیان کە وازی لێدەهێنیت : ئەوەیە کە هیچ لە دیاری و بەخششەکانی فەرمانڕەواکان قبوڵ نەکەیت ئەگەر تەنانەت زانیشت کە حەڵاڵە ؛ چونکە چاوچنۆکی لەوانەوە ئاین تێکدەدات ؛ چونکە لەوەوە چاوپۆشین سەرهەڵدەدات ، و ڕەچاوکردنی لایەنگری کردنیان و ڕازیبوون لە زوڵمیان ، ئەمە هەمووی تێکدانە لە دین ، و کەمترین زیانی ئەوەیە کە بەخششەکانیان قبوڵ بکەیت ، و سود لە دونیایان وەربگریت و خۆشت بوێن ، و ئەوەی کەسێکی خۆش بوێت حەز بە تەمەن درێژی ئەو دەکات ، و مانەوەی بە زەرورەت ، و لە خۆشویستنی مانەوەی زاڵم ئیرادەیە لە زوڵم بەسەر بەندەکانی خودای گەورە ، و ئیرادەی تێکچوونی جیهان ، بۆیە هەرشتێک لەمە زیانبەخش تر بوو ئەوا دەکەوێتە سەر ئاین و عاقیبەت .

و نەکەی هەرگیز کە هەڵ بخەڵەتێیت بە هەوای شـــەیتان یان قســـەی هەندێک خەڵک بۆت : کە وەها باشتر و لەپێشترە کە دینار و درهەمیان لێ وەربگریت ، و دابەشـی بکەیت بە نێو هەژار و نەدارەکان ؛ چونکە ئەوان پارە دەدەن لەسەر فیسق و بێفەرمانیکردن ، و تۆ خۆت پارە بدەیت بە هەژارەکان زۆر باشترە لە پارەی ئەوان ؛ چونکە شەیتان زۆر ملی خەڵکی پەڕاندووە بەم وەسوەسەیە و نەهامەتیەکەی گەورەیە ، لە کتێبی (إحياء العلوم) باسمان کردووە داوای بکە پاشان .

و ئەو چوار شتەی کە پێویستە ئەنجامی بدەیت :

یەکەم : ئەوەیە کە مامەڵەکردنت لەگەڵ خودای گەورە بێت ، بەشێوەیەک کە ئەگەر خزمەتکارەکەت مامەڵەت لەگەڵ بکات بەو شـــێوەیە لێی قبوڵ بکەیت ، و پەســـت نەبیت لێی و لێی توڕە نەبیت ، و ئەوەی پێی ڕازی نابیت بۆ خۆت لە خزمەتکارە مەجازیەکەت بەهەمان شـــێوەی پێی ڕازی مەبە لە خۆت بۆ خودای گەورە کە گەورەی ڕاستەقینەی تۆیە .

و دووەم : هەرکات مامەڵەت لەگەڵ خەڵک کرد وای لێبکە بەشـــێوەیەک بێت کە تۆ پێی ڕازی بێت لەوانەوە بەو شـــێوەیە مامەڵەت لەگەڵ بکرێت ؛ چونکە ئیمانی بەندەیەک کامڵ نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشـە بۆ هەموو خەڵک پێی خۆشبێت .

و ســـێهەم : ئەگەر زانســـتت خوێند یاخود ســـەیرت کرد ، پێویســـتە زانستەکان زانستێک بێت کە دڵت چاک بکاتەوە و نەفست خاوێن بکاتەوە ، تەنانەت ئەگەر زانیبێتت لە تەمەنت هەفتەیەک ماوە ، بۆیە لە زەرورەتدا خۆت سەرقاڵ مەکە بە زانستی فیقهـــ و خیلاف و ئوسوڵ {بنەماکان} و کەلام و هاوشـێوەکانی ؛ چونکە تۆ دەزانیت ئەم زانستانە ئەو بۆشاییەت پڕ ناکەنەوە ، بەڵکو پێویســـتە ســـەرقاڵ بیت بە چاودێری دڵت ، و زانینی سیفاتەکانی نەفس ، و پشت تێکردنە ئەوەی پەیوەستت دەکات بە دونیاوە ، و خـاوێنکردنەوەی نەفســـت لە ڕەوشـــتی خراپ و ســـەرقاڵبوون بە خۆشـــەویســـتی خودای گەورە و پەرســـتنی ، و خۆ ڕازاندنەوە بە ســـیفاتی

**جوان ، و ڕۆژ و شەوێت تێنەپەڕێت بە سەر بەندەیەکدا کە لەوانەیە مەرگی بێت تێیدا .**

## ئەی ڕۆڵەکەم ..!!

**گوێ بگرە لە قسەیەکی ترم ، و ورد بەرەوە تێیدا بۆ ئەوەی تێیدا ڕزگاربوون بدۆزیتەوە : ئەگەر پێت وترا کە سوڵتان دوای هەفتەیەک سەردانت دەکات .**

**بزانە کە لەم ماوەیەدا تەنها سەرقاڵ دەبیت بە چاککردنەوەی ئەو شتانەی کە لەوانەیە سوڵتان چاوی بکەوێتە سەر لە پۆشاک و لەش ، و ماڵ و فەرش و شتی تر .**

**ئێستا بیر بکەرەوە لەوەی ئاماژەم پێدا چونکە تۆ تێگەیشتویت ، و قسەی تاک بۆ پڕکردنی زەرفێک بەسە ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت :** (إنَّ الله لا يَنْظُرُ إلى أَجْسامِكُم، وَلا إلى أَعمَالِكُم، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إلَى قُلُوبِكُمْ وَنِياتِكُم)[46]**{خودای گەورە سەیری لاشەتان ناکات ، سەیری کردەوەشتان ناکات ، بەڵکو سەیری دڵ و نیەتەکانتان دەکات}.**

**ئەگەر زانستی ئەحواڵی دڵت دەوێت ئەوا سەیری (الإحياء) و دانراوەکانی ترم بکە و ئەم زانستە فەرزە لەسەر هەموو کەسێک ، و ئەوانەی تر فەرزی کیفایەتن مەگەر بە بڕێک کە فەرزەکانی خودای گەورەی پێ بدرێتەوە ، و ئەوە تەوفیقت دەدات بۆ بەدەستهێنانی .**

**و چوارەم : لە دونیادا زیاتر لەوەت کۆ نەکردبێتەوە کە بەشی ساڵێکت بکات ، وەک چۆن پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خودای لەسەربێت ئەوەی ئامادە دەکرد بۆ هەندێک لە ماڵەکانی ، و فەرمووی :** (اللَّهُمَّ اجْعَلْ رزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ كَفافاً)[47]**{خودایە ڕزقی ئالی موحەمەد بەشێوەیەک لێبکە بە بێ خەم بەشیان بکات} ، بۆ هەموو ماڵەکانی خۆی ئامادە نەدەکرد بەڵکو تەنها بۆ ئەوانەی زانیبێتی کە**

---

[46] مسلم گێراویەتیەوە
[47] مسلم گێراویەتیەوە

**لاوازی لە دڵی هەیە ، و ئەوانەی کە خاوەنی یەقین بوون لە قوتی ڕۆژ و نیوێت زیاتری بۆ دانەدەنان .**

**ئەی ڕۆڵەکەم ..!!**

**من لەم بەشەدا پێداویستیەکانتم نوسیوە ، پێویستە لەسەرت کە کاری پێ بکەیت و لەیادم نەکەیت بەوەی لە دووعا چاکەکانت ناوم بێنیت .**

**و سەبارەت بەو دوعایەی کە داوات لێکردم ئەوا دوعاکانی صحاح {سونەتی نەبەوی شەریف} داوا بکە ، و ئەم دوعایەش بخوێنەرەوە لە دەرفەتەکانت دا ، بەتایبەتی لە دواى نوێژەکانت :**

**اللهم إني أسأْلُكَ مِنَ النّعمة تـمامَها * ومِنَ العِصمةِ دوامَها * ومِنَ الرَّحمةِ شُمولَها * ومِنَ العافيةِ حُصولَها * ومِنَ العيشِ أرغَدَهُ * ومِنَ العُمرِ أسعدَهُ * ومِنَ الإحسانِ أتـمَّهُ * ومِنَ الإنعامِ أعمَّهُ * ومِنَ الفضلِ أعذبَهُ * ومِنَ اللطفِ أنفعَهُ وأقربَهُ * اللهم كُنْ لنا ولا تكُن علينا * اللهم اختِم بالسَّعادةِ آجالَنا * وحقِق بالزِّيادةِ آمالَنا * واقرُن بالعافيةِ غُدوَّنا وآصالَنا * واجعل إلى رحمتِك مصيرَنا ومآلنا * واصبُب سِجالَ عفوِكَ على ذُنوبِنا * ومُنَّ علينا بإصلاحِ عيوبِنا * واجعلِ التقوى زادَنا * وفي دِينِكَ اجتهادَنا * وعليكَ توَكُّلنا واعتِمادَنا * وثبِّتنا على نهجِ الإستقامةِ * وأعِذنا في الدُّنيا مِن مُوجِبات النَّدامة يومَ القيامة * وخفِّف عنَّا ثِقلَ الأَوزار ، وارزُقنا عِيشةَ الأبرار * واكفِنا واصرِف عنا شرَّ الأشرار * واعتِق رِقابَنا ورِقابَ آبائِنا وأُمَّهاتِنا وأولادِنا وإخوانِنا وأخواتِنا وقراباتِنا وعشيرتِنا مِن عذابِ القبرِ ومن النار برحمتِكَ يا عزيزُ يا غفار * يا كريمُ يا ستَّار * يا حليمُ يا جبَّار* يــا أللهُ يــا أللهُ يــا رحيم ، يا رحيم ، يا أرحم الراحمين و يا أول الأولين ، ويا أخر الاخرين ، ويا ذا القوة المتين ، ويا راحم المساكين ، ويا أرحم الراحمين ، لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين**

**وصلى الله على سيدنا محمد و آله وصحبه آجمعين**

**والحمد لله رب العالمين**

